# ئۆراكڵ - SQL

ORACLE®
Database




+ دابەزاندنی ئـــۆراكڵ
+ فێركاری ئـــــۆراكڵ
+ دروستكردنی خشـــته
+ دروســـتكردنی User
+ كـــــۆدەكانی SQL

ئامادەكردنی
محمد كاظم جاف

زانكۆی سلێمانی 2016

m.kazm81@gmail.com م.محمد

پێشكەشە بە فێرخوازان

ORACLE®
Database




+ دابەزاندنی ئـــۆراكڵ
+ فێركاری ئـــــۆراكڵ
+ دروستكردنی خشـــته
+ دروســـتكردنی User
+ كــــــۆدەكانی SQL

پێشكەشە بە فێرخوازان


ئامادەكردنی
محمد كاظم جاف

م.محمد m.kazm81@gmail.com



زانكۆی سلێمانی 2016


## بەرنامەی Oracle:

ئۆراكڵ یەكێكە لەبەرنامە بەهێزەكانی دروستكردنی داتابەیس، ئۆراكـڵ لەزۆربەی وڵاتــانی رۆژئــاوا بەكاردێــت، كۆمپانیــا بەناوبانگەكــانی جیهــان ئەم بەرنــامەیە بەكاردێنن، لەبەر بەهێزی پاراستن و متمانەی لەپاراستنی داتاو زانیاریەكاندا.
ئەم بەرنامەیە توانای لەخۆگرتنی زانیاری زۆری هەیە هەر بۆیە لەبانک و شـوێنە هەستیارەكاندا بەكاردەهینرێت.
ئەم بەرنــامەیە وەكــو زۆربەی بەرنامەكــانی تــر لەســەر كۆمپیــوتەرەكە دایدەبەزێنیت بۆ ئەوەی كاری تێدابكەیت بۆ ئەم مەبەستە دەبێت سیدیەكمان هەبێت بەرنامەكەی تێدابێت.
وەكـو هەمـو بەرنـامەیەكی تـر كۆمەڵێـک هەنگـاو هەیە لەكـاتی دابەزانـدنی بەرنامەكەدا جێبەجێی دەكەین بەڵام دەبێت ئــاگاداربین لە كاتی دابــەزاندنی بەرنامەكەدا لە هـەنگاوێكدا داوای پاسۆردێک دەكات بۆ بەرنامــــەكە دەبێت ئەو پاسۆردە لەیاد نەكەین چونكە دوای دابەزاندنی بەرنامەكە هەمو كاتدەبێت بەو پاسۆردە بچینە ناوبەرنامەكەكە لەكاتی دابەزاندندا داوای كردبوو



# دابەزاندنی بەرنامەی ئۆراکڵ

سەرەتا دەچینە ناو سیدی بەرنامەکەوە و کلیک لە ئایکۆنی  Setupدەکەیـن هەنگاوەکان جێبەجێدەکەین









Oracle Database 11g Express Edition - Install Wizard 

**Choose Destination Location**

Select folder where setup will install files.

ORACLE DATABASE EXPRESS EDITION

Setup will install Oracle Database 11g Express Edition in the following folder.

To install to this folder, click Next. To install to a different folder, click Browse and select another folder.

☑ Oracle Database 11g Express Edition 563556 K

پاشان Next بکە

Destination Folder

C:\oraclexe\ Browse...

Space Required on C: 563556 K

Space Available on C: 23005756 K

InstallShield

Back Next Cancel

Oracle Database 11g Express Edition - Install Wizard 

**Specify Database Passwords**

Enter and confirm passwords for the database. This password the SYSTEM database accounts.

Enter Password ||||||||||

Confirm Password ||||||||||

لێرەدا پاسۆرد دابنێ
ئاگاداربە دواتر بەم
پاسۆردە داخڵ دەبیت
بەڵام ناوەکە بەرنامەکە
خۆی دایدەنێت ناوەکەش
System
یان
Sys
دەبێت
پاشان Nextبکە

InstallShield

< Back Next > Cancel

Oracle Database 11g Express Edition - Install Wizard 

**Summary**

Review settings before proceeding with the installation.

ORACLE DATABASE EXPRESS EDITION

Current Installation Settings:

Destination Folder: C:\oraclexe\
Oracle Home: C:\oraclexe\app\oracle\product\11.2.0\server\
Oracle Base:C:\oraclexe\
Port for 'Oracle Database Listener': 1521
Port for 'Oracle Services for Mic
Port for 'Oracle HTTP Listener':

پاشان Install بکە

InstallShield

Back | Install | Cancel

Oracle Database 11g Express Edition - Install Wizard 

**InstallShield Wizard Complete**

Setup has finished installing Oracle Database 11g Express Edition on your computer.

ORACLE DATABASE EXPRESS EDITION

دوایی هەنگاوەکان لەم خشتەداFinishبکە

Back | Finish | Cancel

# بەرنامەی ئۆراکڵ

## Oracle Databse




دوای دابەزاندنی بەرنامەکە ئایکۆنەکە دێتە سەرشاشەکە یان لە لیستی پرۆگرامدا دەردەکەوێت

لەم شێوەیەیە کلیکی Go To Database Home Page لێبکە بۆ ئەوەی لەبەرنامەکەدا ئیش بکەیت

Database Login

Enter your database username and password.

Username system

Password ••••••••••

Login

Click here to learn how to get started

دوای کردنەوە بەرنامەکە داوای ناو و پاسۆردت لێ دەکات یەکەمجار ناوەکەی system و پاسۆردەکەی خۆمان دامانا لەکاتی دابەزاندنی بەرنامەکەدا و دوایی دەتوانیت بیگۆریت بەئارەزووی خۆت




ئیستا دەچیتە ناو بەرنامەکە و ئەم شێوەیەت بۆ دەردەکەوێت، کۆمەڵیک ئایکۆنی سەرەکی تێدایە، لەبەشی سەرەوە ئایکۆنیکی تێدایە Logout بۆ چوونە دەرەوەیە لەبەرنامەکە

# چۆنیەتی دروستکردنی User




بۆ دروستکردنی یوزەر دەچینە سەر بەشی Administration کلیکی لەسەر دەکەین چەند ئایکۆنێکی تردەکرێتەوە

Home > Administration























دواتر کلیک لەسەر ئایکۆنی database User دەکەین و Creat User هەڵدەبژێرین، خشتەیەکمان بۆ دەکرێتەوە

**Create Database User** Cancel Create

* Username: sina
* Password: •••••
* Confirm Password: •••••
Expire Password ☐
Account Status: Unlocked
Default Tablespace: **USERS**
Temporary Tablespace: **TEMP**

**User Privileges**

Roles:
☑ CONNECT ☑ RESOURCE ☐ DBA

Direct Grant System Privileges:

| | | |
|---|---|---|
| ☐ CREATE DATABASE LINK | ☐ CREATE MATERIALIZED VIEW | ☐ CREATE PROCEDURE |
| ☐ CREATE PUBLIC SYNONYM | ☐ CREATE ROLE | ☐ CREATE SEQUENCE |
| ☐ CREATE SYNONYM | ☐ CREATE TABLE | ☐ CREATE TRIGGER |
| ☐ CREATE TYPE | ☐ CREATE VIEW | |

Check All Uncheck All

**Create Database User**

* Username: sina
* Password: •••••
* Confirm Password: •••••
Expire Password ☐
Account Status: Unlocked
Default Tablespace: **USERS**
Temporary Tablespace: **TEMP**

ئەم بەشە بۆ دانانی ناوو پاسۆرد بۆ یوزەرەکە، دواتر بۆ چونە ناو یوزەرەکە کارکردن تیایدا بەم ناو و پاسۆردە دەچیتە ناو یوزەرەکەوە

**User Privileges**

Roles:
☑ CONNECT ☑ RESOURCE ☐ DBA

Direct Grant System Privileges:

| | | |
|---|---|---|
| ☐ CREATE DATABASE LINK | ☐ CREATE MATERIALIZED VIEW | ☐ CREATE PROCEDURE |
| ☐ CREATE PUBLIC SYNONYM | ☐ CREATE ROLE | ☐ CREATE SEQUENCE |
| ☐ CREATE SYNONYM | ☐ CREATE TABLE | ☐ CREATE TRIGGER |
| ☐ CREATE TYPE | ☐ CREATE VIEW | |

Check All Uncheck All

**User Privileges:** ئەم بەشەی کۆمەڵێک هەڵبژاردەی تێدایە بۆ یوزەرەکە بۆ نمونە ڕێگە بە یوزەر بدەیت خشتە دروست بکات یان فیو دروست بکات لەناو یوزەرەکە بۆ دیاریکردنی هەڵبژاردەکە نیشانەی ڕاست دەدەیت لە بۆشاییەکە

**Create Database User** [Cancel] [Create]

دوای تەواوکردنی کارەکان بۆ دروستکردنی یوزەرەکە کلیک لەسەر ئایکۆنی Craete دەکەین، کەلەبەشی سەرەوەی خشتەکەدایە

**Search Username** [ ] **View** Icons **Show** Database Users


HR


SIMA


SINA


SINA1

دواتر سەیری دەکەینەوە دەبینین یوزەرەکە دروست بووە، دەتوانین چەندین یوزەر بەو ڕێگایە دروست بکەین

# چۆنیەتی گۆڕینی پاسۆردی ئۆراکڵ






دەتوانیت لێرەدا پاسۆردی بەرنامەکە بگۆڕیت
کلیک لەسەر ئایکۆنی **Administration**
دەکەین لیستێک دەکرێتەوە، لەناو لیستەکەدا
کلیک لەسەر
**chang my password** دەکەین،
خشتەیەکمان بۆ دەکرێتەوە

Change Password — Cancel — Apply Changes

User Name **SYSTEM**
Old Password •••••
New Password •••••
Confirm Password •••••

لەم خشتەیەدا سێ خانەمان هەیە، خانەی یەکەم پاسۆردەکە کۆنەکە بنوسەو
لە خانەکانی دووەم و سێیەم پاسۆردەکە تازە بنوسەو و ئیتر بەم پاسۆردە
تازەیە دێیتە ناو بەرنامەکەوە دەبێت ئاگاداربیت ئەم پاسۆردەت بیرنەچێت
دواتر لەبەشی سەرەوەی خشتەکەدا کلیک لەسەر ئایکۆنی **Apply Changes**
دەکەین بۆ جیبەجێکردنی کارەکە

**Database Login**

Enter your database username and password.

**Username** system
**Password** ••••••••••
Login

Click here to learn how to get started

دواتر بەم پاسۆردە تازەیە دەچینە
ناو بەرنامەکەوە

# چۆن گۆرانکاری له Userدا دەکەین؟

دوای ئەوەی یوزەرمان دروست کرد ئەگەر بمانەوێت گۆرانکاری لەو یوزەرەدا بکەین یان دەسەڵاتی زیاتری پێبدەین بۆنمونە گۆرینی پاسۆرد یان دەسەلاتی زیاتری پێبدەین بۆ ئیشکردن




کلیک له ئایکۆنی Administrationو دواتر
کلیک له ئایکۆنی Database User دەکەین
پاشان کلیک لەسەر Manage Userدەکەین و یوزەرەکانمان پیشان دەدات، ئەو یوزەرە هەڵدەبژێرین که دەتەوێت گۆرانکاری تێدا بکەیت
و دوایی کلیک لەسەر یوزەرەکە بکە خشتەیەکمان بۆ دەکرێتەوە، هەر هەمان ئەو خشتەیەیە کە یەکەمجار یوزەرمان تێیدا دروستکردووە

Manage Database User — Cancel — Drop — Alter User

Username SINA
Password
Confirm Password
Expire Password
Account Status Unlocked
Default Tablespace: USERS
Temporary Tablespace: TEMP

User Privileges

Roles:
CONNECT RESOURCE DBA

Directly Granted System Privileges:
CREATE DATABASE LINK — CREATE MATERIALIZED VIEW — CREATE PROCEDURE
CREATE PUBLIC SYNONYM — CREATE ROLE — CREATE SEQUENCE
CREATE SYNONYM — CREATE TABLE — CREATE TRIGGER
CREATE TYPE — CREATE VIEW

Check All Uncheck All

لەم خشتەیەدا دەتوانیت گۆرانکاری لە پاسۆرد و هەڵبژاردەکانی یوزەردا بکەیت دواتر لەبەشی سەرەوە کلیک لە Alter User دەکەین بۆ جێبەجێکردنی کارەکەمان

# چۆن Userدەسڕینەوە؟

ئەگەر بمانەوێت یوزەرێک بسڕینەوە ئەوا کلیک لە ئایکۆنی Administrationو دواتر کلیک لە ئایکۆنی User Database دەکەین پاشان کلیک لەسەر Manage Userدەکەین و یوزەرەکانمان پیشان دەدات، ئەو یوزەرە هەڵدەبژێرین کە دەتەوێت بیسڕیتەوە، دوای کلیک لەسەر یوزەرەکە خشتەیەکمان بۆ دەکرێتەوە، هەر هەمان خشتەیە کە یەکەمجار یوزەرمان تێیدا دروست کردووە

| Manage Database User | Cancel | Drop | Alter User |
|---|---|---|---|
| Username SINA | | | |
| Password | | | |
| Confirm Password | | | |
| Expire Password ☐ | | | |
| Account Status Unlocked | | | |
| Default Tablespace: USERS | | | |
| Temporary Tablespace: TEMP | | | |

**User Privileges**

Roles:

☑ CONNECT ☑ RESOURCE ☐ DBA

Directly Granted System Privileges:

| | | |
|---|---|---|
| ☐ CREATE DATABASE LINK | ☐ CREATE MATERIALIZED VIEW | ☐ CREATE PROCEDURE |
| ☐ CREATE PUBLIC SYNONYM | ☐ CREATE ROLE | ☐ CREATE SEQUENCE |
| ☐ CREATE SYNONYM | ☑ CREATE TABLE | ☐ CREATE TRIGGER |
| ☐ CREATE TYPE | ☑ CREATE VIEW | |

Check All Uncheck All

لەم خشتەیەدا چۆن توانیمان گۆرانکاری لە یوزەردا دروستبکەین بەهەمان شێوە دەتوانین یوزەرەکە بسرینەوە بۆ ئەم مەبەستە لەبەشی سەرەوەی خشتەکە کلیک لەسەر ئایکۆنی Drop دەکەین، پاشان بۆ دڵنیابون خشتەیەکی ترت ئەداتێ کلیک لە ئایکۆنی Drop Userبکە یوزەرەکەت بۆ دەسڕێتەوە

| Drop Database User | Cancel | Drop User |
|---|---|---|
| Please confirm your request. | | |
| Drop User: SINA1 | | |
| Cascade ☐ | | |

نیشانەی راست لەم هەڵبژاردەیە بدە

# دروستکردنی خشـــته

ئەگەر بمانەوێت خشتەیەک دروست بکەین دەبێت لەناو یوزەرێکدا دروستی بکەین، بەڵام دەبێت پێشتر دەسەڵاتی ئەوەمان بە یوزەرەکە دابێت تا بتوانێت خشتە دروست بکات، وەکو لە پێشتردا باسمان کردووە

Manage Database User — Cancel | Drop | Alter User

Username SIMA
Password
Confirm Password
Expire Password ☐
Account Status Unlocked
Default Tablespace: USERS
Temporary Tablespace: TEMP

User Privileges

Roles:
☑ CONNECT ☑ RESOURCE ☐ DBA

Directly Granted System Privileges:

| | | |
|---|---|---|
| ☐ CREATE DATABASE LINK | ☐ CREATE MATERIALIZED VIEW | ☐ CREATE PROCEDURE |
| ☐ CREATE PUBLIC SYNONYM | ☐ CREATE ROLE | ☐ CREATE SEQUENCE |
| ☐ CREATE SYNONYM | ☑ CREATE TABLE | ☐ CREATE TRIGGER |
| ☐ CREATE TYPE | ☐ CREATE VIEW | |

Check All Uncheck All

ئەم بەشانەی خوارەوە پێدانی دەسەڵاتە بە یوزەر، لێرەدا نیشانەی راست دەدەیت لە Creat Table بۆ ئەوەی بتوانیت لەناو ئەم یوزەرەدا خشتە دروست بکەیت

دواتر لە سیستمەکە دەردەچین و بەناوو پاسۆردی خۆی دەچینە ناو ئەو یوزەرەوە کە دەمانەوێت خشتەکەی تێدا دورست بکەین

Database Login

Enter your database username and password.

Username sima
Password ••••••
Login

Click here to learn how to get started

لەم دوو بۆشایەدا ناو و پاسۆردی یوزەرەکە دەنوسین و دەچینە ناو یوزەرەکەوە بۆ دروستکردنی خشتەکە

ئێستا بە ناو و پاسۆرد چوینە ناو یوزەرکەوە بۆ دروستکردنی خشتە کلیک لەسەر Object Browserدەکەین و لیستێک دەکرێتەوە پاشان کلیک لە Creat دەکەین و لیستێکی تر دەکرێتەوە، کلیک لە Table دەکەین







پاشان بەشێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە لەم بەشەدا خشتەکە دروست دەکەین، لەخانەی سەرەوە ناوی خشتەکە دەنێین بە ئارەزووی خۆت ناوێکی بنێ، بەڵام *نابێت ناوی خشتە بە هێما دەست پێبکات و *دوبارە بێت پێشتر ناوێکی ترمان بەو ناوەوە هەبێت، *نابێت سپەیس لەنێوان وشەکاندا هەبێت

Table

Columns
Primary Key
Foreign Key
Constraints
Confirm

Create Table — Cancel — Next >

* Table Name: computer ☐ Preserve Case

| Column Name | Type | Precision | Scale | Not Null | Move |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |

Add Column

لەبەشی Column Nameدا ناونیشانی خانەکە دەنوسین لە بەشی Type جۆری ئەو داتایە دیاریدەکەین کە داخڵی دەکەین بۆ نمونە ID جۆری داتاکەی Number ە جۆری داتای Name ەکە پیتە وە هەر خانەیەکمان دروستکرد جۆر و شێوازەکانی دیاری دەکەین و لەبەشی سەرەوە Next دەکەین بۆ بەشێکی تر

| Column Name | Type | Precision | Scale | Not Null | Move |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ID | NUMBER | | | ☐ | ▼▲ |
| NMAE | VARCHAR2 | | 30 | ☐ | ▼▲ |
| AGE | NUMBER | | | ☐ | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |

هەڵبژاردەی دووەم دیاری دەکەین و لەبەشی Primary key پرایمەرکی بۆ Id دادەنێین و Next دەکەین و پاشان Next و دواتر Finish دەکەین لە بەشی کۆتایدا Create دەکەین خشتەکەمان بۆ دروست بوو

ئێستا خشتەکەمان دروستکرد، لەخوارەوە دیارە پێکهاتووە لە سێ فیلّد ID،Name،Age و دەتوانین داتا و زانیاری داخڵ بکەین

Table Data Indexes Model Constraints Grants Statistics UI Defa

Add Column | Modify Column | Rename Column | Drop Column | Rename | Co

| Column Name | Data Type | Nullable | Default | Primary Key |
|---|---|---|---|---|
| ID | NUMBER | No | - | 1 |
| NMAE | VARCHAR2(30) | Yes | - | - |
| AGE | NUMBER | Yes | - | - |
| | | | | 1 - 3 |

دەتوانین گۆرانکاری لەم خشتەیەدا بکەین یان دەتوانین دێر و ستون زیادبکەین لەم خشتەیەدا، هەمو ئەم کردارانە بەو ئایکۆنانە دەکرێت کەلەبەشی سەرەوەی خشتەکەدا دیارە کە دواتر باسی زۆربەیان دەکەین

ئێستا ئەگەر بمانەوێت هەندێ داتا داخڵ بکەین لە ئایکۆنەکانی سەرەوە کلیک لە Data دەکەین دواتر کلیک لە Insert Row دەکەین

Table Data Indexes Model Constraints

Query | Count Rows | Insert Row

This table contains no data.

پاشان ئەم بەشە دەکرێتەوە، ئێستا لە خانەکاندا داتا داخڵ بکە ئێمە لە خانەی id ژمارە یەک و لەخانەی Nameدا ناوێکمان داخڵکردووە، لەخانەی Age دا ٣٢ مان داخڵ کردووە و کلیک لە Createدەکەین

Create Row | Cancel | Create | Create and Create Another

| Table: | COMPUTER |
|---|---|
| * Id | 1 |
| Nmae | Muhamad |
| Age | 31 |

Table Data Indexes Model Constraints

Query | Count Rows | Insert Row

| EDIT | ID | NMAE | AGE |
|---|---|---|---|
| | 1 | Muhamad | 31 |
| row(s) 1 - 1 of 1 | | | |

Download

ئێستا دەبینین داتاکان داخڵ بون

بمانەوێت هەر گۆڕانکایەک لەم خشتەیەدا بکەین وەکو باسمانکرد دەتوانین بە ئایکۆنەکانی سەرو خشتەکە گۆڕانکاریەکان بکەین

## دروستکردنی Create View

ئەم بەشە بۆ مەبەستی راکێشانەوەی زانیاریەکان و شیکارکردنی زانیاریەکان بەکاردێت، قەبارەی بچوکە چونکە زانیاری خشتەکە بەکاردێنێتەوە

بۆ دروستکردنی ئەم بەشە دەبێت وەکو روستکردنی نەخشەکە دەسەڵات بدەین بە یوزەرەکە بۆ ئەوەی بتوانین دروستی بکەین، ئەم دەسەڵاتەش لەهەمان شوێنی پێدانی دەسەڵاتی خشتە دروستکردنەکەیە.

پاشان کلیک لە Object Browser دەکەین دواتر لە لیستەکەداCreateپاشان View هەڵدەبژێرین و ڤیوەکە دروست دەکەین






دواتر ئەم بەشە دەکرێتەوە لە بۆشایی View Name دا ناوەکەی دەنوسین

View

Definition
Confirm

Create View   Cancel   Next >

Schema SYSTEM
* View Name Sima   Preserve Case
* Query

[Query Builder]   [SQL Commands]

A view is a tailored presentation of the data contained in one or more tables or other views. A view takes the output of a query and treats it as a table. Think of a view as a stored query or a virtual table.

پاشان کلیک لە Query Builder دەکەیـن و بەشـێکی تـر دەکـرێتەوە، ئەو خشتەیەی پێشوتر دیاریدەکەین کەدروستمان کردووە دەمانەوێت ڤیو لەسـەر دروست بکەین

ئەو فیلْدانەی دەمانەوێت ڤیویان بۆ دروست بکەین نیشانەی راست دەدەین لە بۆشاییەکەی تەنیشتی و دەینێرێت بۆ بەشی خوارتر

Baidu Browser
127.0.0.1:8080/apex/f?p=4500:1002:2715400755679187:USETEMPLATEID1331040?196993814::1002:P1002_RETURN_INT

Create View
Schema SYSTEM
* View Name sima
* Query

sina
SINA

Cancel   Return   Run

SINA
ID
NAME
ADDRESS

Conditions   SQL   Results   Saved SQL

| Column | Alias |
|---|---|
| ID | ID |
| NAME | NAME |

[Query Builder]

A view is a tailored presentation of the data contained in one or more tables or other views. A view takes the output of a query and treats it as a table. Think of a view as a stored query or a virtual table.

پاشان لەبەشی سەرەوە Run دەکەین بۆ ئەوەی داتای ناو خشتەکەمان بۆ بێنێت بۆ ناو ڤیوەکە, پاشان Return دەکەین بۆ گەرانەوە بۆ ناو بەشی ڤیوەکە

sina
SINA
Cancel Return Run

پاشان Next دەکەین پاشان Create

Create View
Cancel Next >
Schema SYSTEM
* View Name SIMA
Preserve Case
* Query

```
select   "SINA"."ID" as "ID",
         "SINA"."NAME" as "NAME",
         "SINA"."ADRESS" as "ADRESS"
 from    "SINA" "SINA"
```

[Query Builder] [SQL Commands]

A view is a tailored presentation of the data contained in one or more tables or other views. A view takes the output of a query and treats it as a table. Think of a view as a stored query or a virtual table.

دواتر دەبینین ڤیوەکەمان بۆ دروستبووە

وەکو بیرخستنەوەیەک ئێمە رێگەماندا بە یوزەرەکە تا بتوانێت خشتەو ڤیو دروست بکات ئەگەر لە دەسەڵاتەکانی یوزەردا ئەو دوو دەسەڵاتەمان بۆ هەڵنەبژاردایە نەمانئەتوانی خشتەو ڤیو دروست بکەین

View Code Data Grants UI Defaults Dependencies SQL

Compile Drop

| Column Name | Data Type | Nullable |
|---|---|---|
| ID | NUMBER(10,20) | No |
| NAME | VARCHAR2(50) | Yes |
| ADRESS | VARCHAR2(50) | Yes |

## تایبەتمەندی زیاتری خشتەکە:

کاتێک دەنوسین ID جۆرەکەی (Type) دەبێت Number بێت دواتر مەرجی بۆ دادەنێین ئەویش لە ژێر Precision دا دەینوسین ئەم Precision مەرجە بۆ ژمارەی تەواو واتە چەند ژمارە پێش فاریزە پیشان بدات بۆ نمونە ژمارە 2015چوار ژمارەیە یان چوار خانەیە

Scale بۆ پاش فاریزەیە واتە دوای فاریزە چەند ژمارە دەربکەوێت بۆنمونە 105.54 دوو ژمارەمان هەیە دوای فاریزە

بەشی Not Null ئەگەر نیشانەی راست بدەین لەم بەشی واتە پێویستە ئەو خانەیە پربکەیتەوە

Create Table | Cancel | Next >

* Table Name: sima ☐ Preserve Case

| Column Name | Type | Precision | Scale | Not Null | Move |
|---|---|---|---|---|---|
| id | NUMBER | 1 | 30 | ☐ | ▼▲ |
| name | VARCHAR2 | | 30 | ☐ | ▼▲ |
| age | NUMBER | 18 | 50 | ☐ | ▼▲ |
| adress | VARCHAR2 | | 30 | ☐ | ▼▲ |
| date1 | DATE | | | ☐ | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |

Add Column

لە بەشی خوارتردا فیڵدی Name زیاد دەکەین جۆرەکەی VARCHAR2 دیاریدەکەین، لەبەشی Scale دا ژمارە ٣٠ دەنوسین واتە تا ٣٠ پیت رێگەت پێدەدات لەو خانەیەدا بینوسیت

وەهەروەها فیڵدەکانی تریش بەهەمان شێوە پردەکەیتەوە جۆرو مەرجەکانی بۆ دیاریدەکەین

**<u>تێبینی</u>** : نابێت وشەیەک بەکاربێنین بۆ ناوی خشتەو فیڵدەکان کە لە Keyword ی بەرنامەدا هەبێت بۆنمونە Number یان Date چونکە ئەم وشانە Keyword ن لەناو بەرنامەکەدا و قبوڵی ناکات

**Create Table** Cancel Next >

* Table Name sima ☐ Preserve Case

| Column Name | Type | Precision | Scale | Not Null | Move |
|---|---|---|---|---|---|
| id | NUMBER | 1 | 30 | ☐ | ▼▲ |
| name | VARCHAR2 | | 30 | ☐ | ▼▲ |
| age | NUMBER | 18 | 50 | ☐ | ▼▲ |
| adress | VARCHAR2 | | 30 | ☐ | ▼▲ |
| date1 | DATE | | | ☐ | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |

Add Column

ئەگەر فێلدەکانت زۆرتربون لەو ماوەیەی بەشەکە هەیەتی بە کلیک لە ئایکۆنی Add Column فێڵدێکی تر زیاد دەکەین بۆ خشتەکە، دەتوانین چەند فێلدێکی تر زیاد بکەین بۆ خشتەکە بە پێی پێویستی خۆمان

Columns → Primary Key → Foreign Key → Constraints → Confirm

**Constraints** Cancel < Previous Finish

| Constraint Name | Type | Column(S)/Check |
|---|---|---|

**Add Constraint** Add

◉ Check ○ Unique

* Name SIMA1_ck1

ئەم بەشــە بــریتیە لە مەرج دانـان بـۆ خشــتەکە لە هەڵبــژاردەی Check دا دەتوانێن چەند کارێکی گرنگ بکەین، بۆنمونە دەتەوێت خانەیەک فـڵانە نـاو یـان فـڵانە ژمـارەی تێـدا داخڵکـرا فـڵانە کاربکـات، ئەم مەرجە لەبەشــی بۆشایەکەدا دەنوسین

بەشێکی تر لەم بەشەدا بریتیە Unique، ئەم بەشە بۆ ئەوەیە ناوی دوبارە لە فیلّدەکەدا نەبێت، ئەم بەشە ناهێڵێت دوو ناوی وەک یەک لەنـاو فیلّـدەکەدا هەبێت

# Data Type له خشتەدا

کاتێک خشتەکەمان دروستدەکرد بەرامبەر ناوی فێلدەکان دەبوایە جۆری داتاکەشمان دیاریبکردایە ئێستا باسی جۆری داتاکان (Data Type) دەکەین:

Create Table　　Cancel　Next >

* Table Name: sima　☐ Preserve Case

| Column Name | Type | Precision | Scale | Not Null | Move |
|---|---|---|---|---|---|
| id | NUMBER | 1 | 30 | ☐ | ▼▲ |
| name | VARCHAR2 | | 30 | ☐ | ▼▲ |
| age | NUMBER | 18 | 50 | ☐ | ▼▲ |
| adress | VARCHAR2 | | 30 | ☐ | ▼▲ |
| date1 | DATE | | | ☐ | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |
| | - Select Datatype - | | | | ▼▲ |

Add Column

-**Number** لەم بەشەدا دوومەرجمان هەیە :

**Precision** واتە پێش فاریزە چەند ژمارە دەربکەوێت

**Scale** واتە دوای فاریزە چەند ژمارەت هەیە

-**Varchar2** ئەم جۆرە تایبەتە بەنوسین ئەو خانەیە دەتوانێت نزیکەی ٤٠٠٠ پیت وەربگرێت بەڵام ئێمە کەمی دەکەینەوە بۆ ئەوەی شوێن زۆر داگیر نەکات

-**Date** ئەم جۆرە بۆ تایبەتە بە کات و رۆژەوە

-**Char** ئەم جۆرە تایبەتە بە نوسین بەڵام ئەم جۆرە جیاوازی هەیە لەگەڵ **Varchar2** ئەوەیە چەندت نوسی ئەوەندە شوێن داگیردەکات

-**Not Null** ئەگەر ئەم بەشە چالا بکەیت و نیشانەی راست بدەیت لە بۆشایەکە ئەوا پێویستە ئەو خانەیە پڕبکەیتەوە و رێگەت پێنادات بەبەتاڵی جێی بهێڵێت بەڵام ئەگەر چالاک نەبو ئاساییە خانەکە بە بەتاڵی جیبهێڵیت

# داخڵکردنی داتا و زانیاری بۆ خشتە

دوای دروستکردنی خشتەکە دەبێت داتاو زانیاری داخڵبکەین بۆ ناو خشتەکە ئەویش بەم ڕێگەیە دەبێت:

لەبەشی Data کلیک لە

Table Data Indexes Model Constraints

Insert Row دەکەین

Query Count Rows Insert Row

بەشێکی ترمان بۆ دەکرێتەوە

Create Row Cancel Create Create and Create Another

| Table: | SIMAA |
|---|---|
| * Id | 1 |
| Name | Mohamad |
| Adress | Baxtari |
| City | sul |
| Age | 30 |

لەم بەشەدا هەموو ستونەکان دیارن و بۆشایەکی بەتاڵ لەتەنیشتەوە هەیە، هەر خانە و داتای تایبەت بەخۆی بڵاو دەکەینەوە

دواتر Create دەکەین دەبینین داتاکان داخڵبون و بەم جۆرە خشتەکە پڕدەکەینەوە

لە کۆتایدا بەم شێوەیە پیشانمان ئەدات

| EDIT | ID | NAME | ADRESS | CITY | AGE |
|---|---|---|---|---|---|
| | 1 | Mohamad | baxtari | sulamni | 30 |
| | 2 | aso | sachnar | sulamni | 22 |
| | 3 | ali | baxch | sulamni | 33 |

row(s) 1 - 3 of 3

Download

وەکو باسمانکرد گۆرانکاریەکان بە ئایکۆنەکانی سەرەوە دەکرێت و هەر ئایکۆنەو ئیشی تایبەت خۆی دەکات

Table

Add Column | Modify Column | Rename Column | Drop Column | Rename | Copy | Drop | Truncate

بەشی Table ئەم ئایکۆنانەی تێدایە :

Add Column: بۆ زیادکردنی ستونێک

Modify Column: دەتوانیت گۆرانکاری لە ستونێکدا بکەیت

Rename Column: ناوی ستونێک دەگۆریت

Drop Column: ستونێک دەسریتەوە

Rename: ناوی خشتەکە دەگۆریت

Copy : خشتەکە کۆپی دەکەیت

Drop: سرینەوەی خشتەکە

Truncate: سرینەوەی خێرای خشتەکە

Data

Query | Count Rows | Insert Row

بەشی Data ئەم ئایکۆنانەی تێدایە :

Query: زانیاریەکان شیدەکاتەوە لەسەر داتاکان

Count Rows: ژمارەی دێرەکانمان پێدەڵێت

Insert Row : داخڵکردنی داتاو زانیاری

Indexes

Create | Drop

بەشی Indexes ئەم ئایکۆنانەی تێدایە:

Create: بۆ دروستکردنی indexes

Drop : سرِینەوە

- بەشی Constraints بۆ هێنانی هەموو ئەو مەرجانەی لەسەر خشتەکە هەیە
- بەشی Grants لەم بەشەدا ئەتوانیت رێگە بدەیت بە یوزەرەکانی تر خشتەکە ببینن

# بۆ نمونە زیادکردنی ستونێک بۆ خشتە

دوای دروستکردنی خشتە لەوانەیە پێویستیت بەوە بێت گۆرانکاری تێدابکەیت، بۆ ئەم مەبەستە ئایکۆنەکانی بەشی سەرەوە بەکاردێت بۆ گۆرانکاریەکان:




بۆ دۆزینەوەی خشتەکە کلیک لە Object Browser لە شوێنی گەرانەکەدا ناوی ئەو خشتەیە دەنوسین کە پێشتر دروستمان کردووە و ئێستا دەمانەوێت گۆرانکاری تێدا بکەین

دوای دۆزینەوەی خشتەکە گۆرانکاریەکانی تێدا دەکەین

Table Data Indexes Model Constraints Grants Statistics UI Defa

Add Column | Modify Column | Rename Column | Drop Column | Rename | C

| Column Name | Data Type | Nullable | Default | Primary Key |
|---|---|---|---|---|
| ID | NUMBER(1,30) | No | - | 1 |
| NAME | VARCHAR2(30) | Yes | - | - |
| AGE | NUMBER | Yes | - | - |
| ADRESS | VARCHAR2(30) | Yes | - | - |
| DATE1 | DATE | Yes | - | - |
| | | | | 1 - 5 |

ئەگەر بمانەوێت ستونێکی تر بۆ خشتەکە زیاد بکەین ئەوا کلیک لە Add Column دەکەین و بەشێکمان بۆ دەکرێتەوە بۆ نمونە تەلەفونی بۆ زیاد دەکەین، ئەوکاتە جۆر و شێوازی بۆ دیاریدەکەین و next دەکەین پاشان Finish دەکەین

Add Column — Cancel — Next >

Schema: SYSTEM
Table: SIMA1
Add Column [ ] Preserve Case
Nullable NULL (do not require a value)
Type NUMBER
Length 4000
Precision
Scale

# Sequences

Sequencesبریتیە لە ریزێک ژمارە کە دادەنرێت بۆ ئەو خشتانەی primary Key یان هەیە، ژمارەکە دەتوانرێت لە زۆرەوە بۆ کەم بڕوات یان لە کەمەوە بۆ زۆر بڕوات

بۆ نمونە ١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧ ٨

یان ٨ ٧ ٦ ٥ ٤ ٣ ٢ ١

یان دوو دوو بڕوات یان سێ سێ زیاد بڕوات

بۆ نمونە ٢ ٤ ٦ ٨ ١٠ ١٢ ١٤ ١٦

یان ١٦ ١٤ ١٢ ١٠ ٨ ٦ ٤ ٢

کاتێک خشتەیەک دروست دەکەین دەبێت خۆمان ID بۆ بنوسین بە ژمارە بەڵام ئەگەر Sequences مان دانا ئەوا پێویست ناکات ID بنوسین خۆی ئۆتۆماتیک ژمارە دەنوسێت بە هۆی دانانی Sequences

لەکاتی دروستکردنی خشتەکە دەتوانیت دایبنێیت بەم شێوەیە:

**Primary Key** Cancel < Previous Next >

Table name: **TABLEDS**

Primary Key:
- No Primary Key
- Populated from a new sequence
- Populated from an existing sequence
- Not populated

* Primary Key Constraint Name TABLEDS_PK

* Sequence Name TABLEDS_SEQ

* Primary Key ID(NUMBER)

- Select Primary Key -
ID(NUMBER)
NAME(VARCHAR2)
ADDRESS(VARCHAR2)
CITY(VARCHAR2)

لە دروستکردنی خشتەدا (کە پێشتر باسی دروستکردنی خشتەمان کردووە) لەم بەشەدا دایدەنێین بۆ ستونی ID پاشان کە داتاو زانیاریمان داخڵکرد لەبەشی ی ID هیچ ژمارەیەک نانوسین ئۆتۆماتیک بەرنامەکە ژمارەی پێدەدات لەبەر ئەوەی Sequences مان پێداوە، دەتوانین وایلێبکەین دوو دوو یان سێ سێ زیاد یان کەم بکات

# SQL

بەشێکی گرنگە لە ئۆراکڵ و بنچینەی داتا بەیس SQL ە، زۆربەی کارەکانی دروست کردنی خشتەو پەیوەندیەکانی پێدروست دەکرێت SQLکورتکراوەی Structure Query Language

زۆربەی کارەکان بە کۆدی SQLدەکەین بۆ ئەم کارەش بەشی SQL دەکەینەوە لە ئۆراکڵدا




دواتر ئەم بەشە دەکرێتەوە و چەند بەشێکی تری تێدایە




لەبەشی SQL command دەکەینەوە




ئەم بەشە دەکرێتەوە بۆ نوسینی کۆدەکان، کۆدەکانی SQLلەم بەشەدا دەنوسین و لە بەشی سەرەوە کلیک لە ئایکۆنی Run دەکەین ئەنجامەکەی لەبەشی خوارەوە دەردەکەوێ

بۆ پاراستن و خەزنکردنی کۆدەکان دەتوانیت بە ئایکۆن Save خەزنی بکەیت

# دروستکردنی خشتە CREAT TABLE

دروستکردنی خشتە بەSQL دەبێت لە SQL commandsبینوسیت، ئایکۆنی RUN دەکەین و لەبەشی خوارەوە خشتەکەمان بۆ دەردەچێت کە پێشتر باسمان کردووە

```
CREATE TABLE table_name
(
column_name1 data_type(size),
column_name2 data_type(size),
column_name3 data_type(size),
....
);
```

**به شێوەیە گشتی**

-ناوی خشتەکە

-ناوی فیلْدەکان

-جـــۆر

-خانەکە چەند پیت وەربگرێت

ئەمانە دیاریدەکەیت

وە نوسینی هەر دێرێت دەبێت فاریزە بنوسیت

لەئەخیردا دەبێت ); دابنێیت

**نمونە:**

```
CREATE TABLE Persons
(
PersonID int,
LastName varchar(255),
FirstName varchar(255),
Address varchar(255),
City varchar(255)
);
```

خشتەکە ناوی Persons

٥ فیلْدمان هەیە

هەر فیلْدێک ناوی خۆی هەیە

هەر فیلْدێک جۆری داتا تایبەکەی دیاریکراوە

ژمارەی پیتەکانیش بۆ ئەو فیلْدە دیاریکراوە

ئەنجامی کارەکەشم دیارە لەخوارەوە کە خشتەیەکە ٥ فیلْدی هەیە

| PersonID | LastName | FirstName | Address | City |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| | | | | |

